حکومەتی هەرێمی کوردستان- عیراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتیی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# خوێندنەوەی کوردی

## بـــۆ
## پۆلی سێیەمی بنەڕەتی

دانانی
لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە

بژارکردنی
سادق ئەحمد عوسمان روستایی
خسرۆ علی حەسەن ئیسماعیل محەمەد عەبدوڵا
نەمام جلال رشید

چاپی نۆیەم ٢٧١٦ کوردی ٢٠١٦ زایینی ١٤٣٧ کۆچی

# لە سەرەتای ساڵەوە



براکانم! خوشکەکانم!

هاوڕێ خۆشەویستەکانم!

دەرگای مەکتەب کرایەوە

پشووی هاوین بڕایەوە

جا نۆرەی قوتابخانەیە

کە بۆ زانین هێلانەیە

بە یەکتر شاد دەبینەوە

ڕێگای خوێندن دەگرینەوە

کاکەی فەللاح- دیوانی (چرۆ)

## واتای وشەکان:

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| هاوڕێ | : | هەڤاڵ |
| پشوو | : | بهن ڤەدان، حەسانەوە، حەوانەوە |
| مەکتەب | : | قوتابخانە، خوێندنگە |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. چۆن پشووی هاوینت بەسەر برد؟

٢. کوێ بۆ زانین هێلانەیە؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانە بە وشەی گونجاو تەواو بکە:

١. براکانـم ...............

٢. ............... خۆشەویستەکانـم.

٣. جا نۆرەی ...............

٤. کە بۆ ............... هێلانەیە.

## چالاکی (١)

مامۆستا سوودەکانی پشووی هاوین بۆ قوتابییان ڕووندەکاتەوە.

## چالاکی (٢)

کوڕ: ئەم کوڕە          ئەم کوڕانە

تۆش ئەم وشانە وەک ئەوەی سەرەوەی لێبکە.

کرێکار          ...............          ...............

جوتیار          ...............          ...............

کیژ          ...............          ...............

دار          ...............          ...............

گوڵ          ...............          ...............

# ڕەوشتی باش



سیروان خوشکێکی بچووکی هەبوو ناوی (ڤیان) بوو.

ڕۆژێک سیروان لە خوشکە بچووکەکەی خۆی پرسی:

ڤیان! کە دەچیت بۆ قوتابخانە، بە کوێدا دەڕۆیت؟

ڤیان گوتی:

بەسەر قەراغی ڕێگەدا دەڕۆم.

سیروان: ڤیان! ئەگەر ویستت لەم بەری ڕێگەکەوە بپەڕیتەوە ئەوبەری ڕێگەکە چی دەکەیت؟

ڤیان: ئەگەر لە ڕێگە بپەڕمەوە، بەلای ڕاست و چەپــدا دەنۆڕم.

ئەگەر دیتم ئۆتۆمبێلێک دێت، لەلایەکی ڕێگەکە ڕادەوەستم تا ڕادەبورێت، ئینجا دەپەڕمەوە.

سیروان: ڤیان! لە خوێندنگە چی فێر دەبیت؟.

ڤیان: خوێندنەوە و نووسین و ڕەوشتی بەرز و وێنە و ژمارە و گەلێک بابەتی دیکە فێردەبم.




سیروان: لەکاتی پشوودا چی دەکەیت؟.

ڤیان: لە پشوودا دەچمە مەیدانی قوتابخانە و لەگەڵ هەڤاڵەکانمدا گەمە دەکەم و ئازار بە کەس ناگەیەنم.

سیروان: پێم بڵێ، ئەگەر خامە یا شتێکی دیت لە گۆڕەپان دۆزییەوە چی لێدەکەیت؟

ڤیان: ئەگەر قەڵەم یا شتێکی دیم دۆزییەوە بە شوێن خاوەنەکەی دەگەڕێم و دەیدەمەوە. ئەگەر نەمزانی هی کێیە دەیدەمە دەستی مامۆستاکەم.

# واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| خاوەن | : | خودان |
| ڕادەبورێت | : | تێدەپەڕێت |
| ڕێگە | : | جادە، شارێ، شەقام |
| هەڤاڵ | : | برادەر، ئاوەڵ |
| گەمە | : | یاری، وازی، لاری |
| دۆزییەوە | : | دیتیەوە، ڤەدیت |
| دەنۆڕم | : | تەماشا دەکەم |

# ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. سیروان خوشکێکی بچووکی هەبوو، ناوی چی بوو؟

٢. ڤیان، کە دەچووە قوتابخانە، بە کوێدا دەڕۆیشت؟

٣. ڤیان لە قوتابخانە چی فێردەبیت؟

٤. ڤیان لەکاتی پشوودا چی دەکات؟

٥. ڤیان ئەگەر پێنووسێکی، لە گۆڕەپانی قوتابخانەدا دۆزییەوە، چی لێدەکات؟

# چالاکی

بۆ خۆشنووسین

**(قوتابخانە بۆ زانین هێلانەیە)**

ئەم دێرە بە خەتێکی جوان لە تێنووسەکەت دووجار بنووسەوە.



# چۆلەکە و ڕێوی



چۆلەکەیەکی جوانکیلە لە دارستانێک بۆ دانەوێڵە دەگەڕا، لەناکاو ڕێوییەکی لێپەیدا بوو پەلاماری داو گرتی.
چۆلەکەی بەستەزمان لەبەر دەستی ڕێوی تەڵەکەبازدا وەکو بی ناو ئاو دەلەرزی. ڕێوی بە فیزێکەوە لە چۆلەکەی پرسی: ئەرێ پێم ناڵێیت تۆی بێدەسەڵات بۆچی دڵخۆش و بەختیاریت؟ بەڕاستی سەیرە! من بەم هەموو هێزو توانایەمەوە هەمیشە دڵتەنگم، کەچی چۆلەکەیەکی لاوازی وەک تۆ هەردەمە لە ئاوازێک لێدەدەیت و ئەم چڵ و ئەو چڵ دەکەیت. چۆلەکەی بەسەزمان بە ترس و لەرزەوە گوتی: ڕێوی ئەگەر دەتەوێت هۆی بەختیاریم بزانیت بەرم بدە با بفڕمە سەر یەکێک لەو چلأنە، ئەوجا گوێم لێبگرە نهێنی خۆمت بۆ ئاشکرا دەکەم جا ئەگەر گوێم لێبگریت لەوە چاکتر نییە سیسەڵەیەکی وەکو من بخۆی؟



ڕێوی هەندێك بیریكردەوە و ئەوجا چۆلەكەكەی بەڕەڵاكرد.

چۆلەكەكە فڕییە سەر دارێكی بڵندو تۆزێک حەسایەوە، گوتی: ئەی ڕێوی من سەرەڕای بێدەسەڵاتیم هەمیشە دڵخۆش و بەختیارم، چونكە هیچ بیر لە ئازاردانی كەسانی دی ناكەمەوە و زۆرداریم بە خەیاڵ نایەت، بەڵام تۆی فێڵباز بە ئازاردانی بێدەسەڵاتانەوە خەریكیت و هەر بیر لە زۆرداری دەكەیتەوە، لەبەر ئەوە هەموو كاتێک لە غەم و پەژارەدا دەژیت و دوژمنت زۆرە.

# واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| چۆلەکە : | چویچک، کێشکە |
| لەناکاو : | لەپڕ |
| پەلاماریدەدات: | پڕیدەداتێ |
| بە فیزێکەوە: | بە لە خۆبایی بوونەوە، بە لووت بەرزییەوە |
| چڵ : | تای دار، لق |
| سیسەڵەیەکی: | لاواز |
| پەژارە : | خەم، خەفەت |

# ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١. بۆچی ڕێوی پەلاماری چۆلەکەکەیدا؟

٢. ڕێوی بەچی بەناوبانگە؟

٣. نهێنی چۆلەکەکە چی بوو؟

# ددانەکانمان



خوێندکارانی خۆشەویست: دروستی ددانەکانمان نیشانەی تەندروستیمانە، بۆیە پێویستە ئاگاداری ددانەکانمان بین، ڕۆژانە بە فلچە و هەویری ددان بیانشۆین. لە دوای هەر نانخواردنێکدا پاکیان بکەینەوە، شیرینی کەم بخۆین. هەروەها وا باشە جاروبار بچینە لای پزیشکی ددان بۆ پشکنین و پاراستنیان لە کلۆری و نەخۆشی دیکە.

### مرۆڤ بە دوو جار ددانی دێن:

ددانەکانی جاری یەکەم پێیاندەگوترێت: ددانی شیری، ژمارەیان بیست ددانە، لە تەمەنی شەش ساڵی بەو لاوە ئەم ددانانە دەکەون و دوای ماوەیەکی دی ددانی هەمیشەیی دێن کە ژمارەیان سیی‌ودوو ددانە. ئەم ددانە هەمیشەییانە ئەگەر کەوتن ددانی دیکەیان لە جێ نایەتەوە.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| تەندروستی | : | ساخلەمیا لەشی |
| بۆیە | : | لەوا |
| پاکیان بکەینەوە | : | پاکژیان بکەین |
| نەخۆشی | : | نە ساغی |
| پێیاندەگوترێت | : | دبێژنێ |
| بەولاوە | : | ئەولاتر |
| نایەتەوە | : | ناهێتەڤە |

# چالاكی (١)

قوتابییانی خۆشەویست

ئەم ئەندامانەی خوارەوەی لەشی مرۆڤ لەسەر وێنەکە دیاربکە:

نـاوک، سـینگ، چـاو، گـویێ (گوهــ)، ئـەژنۆ (چـۆک)، دەم، ئەنگوست (تبل)، **پێ**، پەنجەی پێ.



## چالاکی (٢)

ددان ⟵ ددانەکان

چاو ⟵ چاوەکان

قوتابی ژیر... تۆش ئەم پەیڤانە وەکو ئەوانی پێشوو لێبکە:

دەست ⟵ ................

ئەنگوست ⟵ ................

پەنجە ⟵ ................

نینۆک ⟵ ................

چۆک ⟵ ................

## چالاکی (٣)

خۆش × ناخۆش

خوێندکاری ژیر: تۆش وەکو سەرەوە پەیڤەکانی لای خوارەوە تەواو بکەو لە ژمارە حەفتەوە خۆت چوار پەیڤی دی بهێنەوە. ئەگەر نەتزانی با مامۆستاکەت یارمەتیت بدات:

١. ساز × ................

٢. بەجێ × ................

٣. ئارام × ................

٤. پەسەند × ..................

٥. ڕێک × ..................

٦. پاک × ..................

٧. ................. × .................

٨. ................. × .................

٩. ................. × .................

١٠. ................. × .................



# قوتابیـــــــــــــــم



قوتابیم لە پۆلی ســـێ
ئازا و ژیر، بـەڕێوجـــێ

بولبولی گچکە و ساوام
لە باخی ژین بێ پەروام

شەیدای گوڵی زانستم
هەر خوێندنە مەبەستم

شەو و ڕۆژ هەوڵـــدەدەم
بەهۆی کتێب پێبگـــەم

تا بگەمە خۆشی ژیان
لە چوارچێوەی کوردستان

"عەزیز مەلا ڕەش"

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| ژیر | : | عاقڵ، هۆشمەند |
| بێ پەروام | : | بێ ترسم، بێ باکم |
| شەیدا | : | عەوداڵ |
| بەڕێوجێ | : | ڕێکوپێک |
| هەوڵدەدەم | : | کۆشش دەکەم، تێدەکۆشم، دخەبتم |
| پێبگەم | : | بیگەمێ، بگەهمێ |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١. تۆ لە قوتابخانە فێری چی دەبیت؟

٢. تۆ شەیدای چیت؟

## راهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانە پڕ بکەوە:

١. قوتابیم لە .................

٢. هەر خوێندنە .................

٣. لە باخی ژین .................

٤. شەو و ڕۆژ .................

٥. بگەمە خۆشی .................

٦. لە چوارچێوەی .................

## چالاکی (١)

خوێندکارێکی دەنگخۆش سروودێکی کوردی بڵێت.

## چالاکی (٢)

بە خەتێکی جوان دووجار ئەم دێرە هۆنراوەیە بنووسەوە.

**بخوێنە چونکە خوێندن**

**مەرهەمە بۆ زامی گەل**

# ئەنجامی درۆکردن



ڕۆڵەکانم، درۆکردن ڕەوشتێکی ناشیرینە، ئەنجامی زۆر خراپە با ئەم چیرۆکەتان لەسەر خراپی درۆکردن بۆ ڤەگێڕم:

جارێکیان، شوانێک مەڕەکانی دەلەوەڕاند، لە پڕ هاواری کرد:

- هۆ خەڵکینە بگەنە هانام، گورگ مەڕەکانی منی خوارد!!

خەڵك بۆ ڕزگارکردنی مەڕەکانی خێرا ڕایان کرد، بەڵام شوان لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

بە خوا وا نەبوو درۆم کرد.

ڕۆژ هات و ڕۆژ چوو، گورگ بە ڕاستی کەوتە ناو مەڕ و ماڵاتەکە و شــوان هاواری لێهەستا:

خەڵکینە، ئەی هاوار گورگ مەڕەکانی منی خوارد، زوو فریام کەون!

خەڵکەکە گوێیان پێ نەدا چونکە پێشتر شوانە درۆی لە گەڵ کردبوون، بۆیە گورگ مەڕەکانی بێ سەروبەر کردن.

جا ڕۆلەکانم... درۆکردن هەموو کاتێک ئەنجامی خراپی هەیە.

هەر وەک پیرەمێردی شاعیر دەڵێت:

درۆزن ئاگری لە ماڵ بەربوو بوو
وتیان درۆیە کەســی بــۆ نــەچوو.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| دەلەوەڕاند | : | دچەراند |
| گوێ | : | گوهـ |
| شڤان | : | شوان |
| مەڕ | : | پەز |
| لەپڕ | : | لەناکاو |
| بگەنە هانام | : | فریام کەون، بمگەنێ |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. شوانەکە چ درۆیەکی کرد؟

٢. خەڵک کە بەهانای مەڕەکانەوە هاتن، شوانەکە چـــی گوت؟

٣. بۆچی خەڵک لە جاری دووەمدا باوەڕیان بە شوانەکە نەکرد؟

# چالاکی (١)

وشه و ڕستەکانی لای خوارەوە بخوێنەوە و ژمارەکانیان لەژێر وێنەی گونجاودا بنووسە:

١. هێلکە دەکات
٢. خێرایە
٣. دەوەڕێت
٤. گارەگار دەکات
٥. کڕ دەکەوێت
٦. شیرمان دەداتێ
٧. بەوەفایە
٨. سواری دەبین
٩. دایکی جووجەڵانە
١٠. دەباڕێنێت
١١. دەحیلێنێت
١٢. خوری هەیە
١٣. دڕە
١٤. بەرزە وڵاخە
١٥. دایکی توتکانە
١٦. دایکی بەرخانە






## چالاکی (٢)

بە هێڵێک ئەم وشانە بە پێچەوانەکانیان بگەهێنە:

| | |
|---|---|
| درۆزن | سەربەستی |
| ناشیرین | دوژمن |
| خراپ | نزیک |
| خێرا | ترسنۆک |
| زوو | جوان |
| ئازا | ڕاستگۆ |
| دوور | کورت |
| دۆست | درەنگ |
| ژێردەستی | چاک |
| درێژ | لەسەرخۆ |

## چالاکی (٣)

بەڕێز مامۆستا/ دەکرێ لەشێوەی نواندنێک ئەم بەسەرهاتە لەناو پۆل لەلایەن چەند قوتابییەکەوە نمایش بکەن.

خۆشت یارمەتی قوتابییەکان بدە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە.

# زانایەکی نەمر



کارزان منداڵێکی زیرەک بوو، دەمێک بوو بیری لە چۆنیەتی پەیدابوونی شەوو ڕۆژ دەکردەوە، بۆیە لە مامۆستای پرسی:

مامۆستا پێمان ناڵێی شەوو ڕۆژ چۆن پەیدا دەبن؟

مامۆستا ئافەرینی لەم پرسیارە کرد و ئەوجا گوتی:

قوتابییانی خۆشەویست:

سەدان ساڵ لەمەوبەر زانایان وایان دەزانی کە خۆر لە ئاسمان دەسوڕێتەوە و بەو سووڕانەوەیە شەو و ڕۆژ پەیدا دەبن.

کارزان: واتە وایان دەزانی کە زەوی بێ جوولەیە و خۆر جوولە و سوڕانەوەی هەیە.

مامۆستا: بەڵێ، بەڵام پاش سەدان ساڵ زانای بەناوبانگی پۆڵەندی (کۆپەر نیکۆس) ئەم بیروڕایەی ڕاستکردەوە.



ئازاد: مامۆستا چۆن هەڵەکەی ڕاستکردەوە؟

مامۆستا: ڕۆڵەکانم، پاش لێکدانەوەیەکی زۆر بۆی دەرکەوت کە خۆر هیچ جوولەی نییە، بەڵکو زەوی دوو جۆر جوولەی هەیە.

جۆری یەکەم، بە ماوەی ساڵێک بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە بەم سوڕانەوەیە هەر چوار وەرزی ساڵ پەیدا دەبن،

(بەهار، هاوین، پاییز، زستان)

جۆری دووەمیش بە ماوەی شەو و ڕۆژێک بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە بەم سووڕانەوەیە شەو و ڕۆژ پەیدا دەبن. بەم زانایان بۆیان دەرکەوت، کە جگە لە جوولەی زەوی خۆریش دوو جوولەی هەیە.

کارزان: زۆر سوپاس مامۆستا گیان.

هەزاران سڵاو لە یادی زانای نەمر کۆپەرنیکۆس* و سوپاس بۆ هەموو زانایان.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| خۆر | : | ڕۆژ |
| دەسووڕێتەوە | : | دەخولێتەوە |
| گۆی زەوی | : | تۆپی زەوی |
| بێ جووڵەیە | : | نابزڤیت، وەستاوە، ناڤیت |

**دوژمنی زانا لە دۆستی نەزان چاکترە.**

* **کۆپەرنیکۆس**: زانایەکی گەردوونناسی پۆڵەندی بوو لە ساڵی ١٤٧٣ز لە دایک بووە و لە ساڵی ١٥٤٣ز کۆچی دوایی کردووە.

## ڕاهێنان

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. سەدان ساڵ لەمەوبەر زانایان وایان دەزانی کە ..............

٢. زەوی بە دەوری خۆردا .............. و هەر .............. پەیدا دەبن.

٣. زانای بەناوبانگی پۆڵەندی .............. بۆی دەرکەوت کە خۆر هیچ .............. نییە.

٤. شەو و ڕۆژ لە ئەنجامی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری .............. پەیدا دەبن.

## چالاکی (١)

**مامۆستای بەڕێز/** لەگەڵ خۆتدا ئەمانە ئامادە بکە:

١.(گۆی زەوی)

٢. چرایەك  کە باشتر وایە گلۆپ بێت،

ئینجا لەبەردەم قوتابییان هەردوو جووڵەی زەوی ڕوونبکەوە، با چرایەکە ببێتە خۆر.

## چالاكی (٢)

خوێندكارانی خۆشەویست:

ئـ - ساڵ چەند وەرزە؟ ناوەكانیان بڵێ و بیاننووسە.

١. .............. ٢. .............. ٣. .............. ٤. ..............

ب- زەوی بە ماوەی چەند كاتژمێر بە دەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە؟ زەوی بـــە مـــاوەی .............. كاتـــژمێر (دەمـــژمێر) بـــە دەوری خـــۆ یـــدا دەسووڕێتەوە.

(ئەگەر نەتزانی لە مامۆستاكەت بپرسە)

پ- زەوی بە چەند ڕۆژ بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە؟

زەوی بە .............. ڕۆژ بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە.

(ئەگەر نەتانزانی لە مامۆستاكەت بپرسە).

## چالاكی (٣)

بە خەتێكی جوان دووجار ئەم دێرە لە تێنووسەكەت بنووسەوە:

﴿خۆر سەرچاوەی ڕووناكی و هەموو وزەیەكە﴾.

## چالاکی (٤)

**قوتابی خۆشەویست/** ساڵ چوار وەرزە و دوازدە مانگیشە، هەر وەرزێک سێ مانگە، ناوی مانگە کوردییەکان ئەمانەن:

| وەرزی بەهار | وەرزی هاوین |
| --- | --- |
| ١. خاکە لێوە (نەورۆز) | ٤. پووشپەڕ |
| ٢. گوڵان (بانەمەڕ) | ٥. خەرمانان |
| ٣. جۆزەردان | ٦. گەلاوێژ |

| وەرزی پایز | وەرزی زستان |
| --- | --- |
| ٧. ڕەزبەر | ١٠. بەفرانبار |
| ٨. خەزەڵوەر (گەڵاڕێزان) | ١١. ڕێبەندان |
| ٩. سەرماوەز | ١٢ ڕەشەمێ |

**خوێندکاری ژیر/** ناوی مانگە کوردییەکان لەبەر بکە.

# سەیرانەک ل کوردستانێ



هۆگر دگەل خێزانا خۆ دچوونە هاڤینگەها بێخال، بڕێڤە و دپەنجەرا ئۆتۆمبێلێ را هۆگری بەرێ خۆ دا سروشتێ کوردستانێ، چیا و گر و دۆل و نهالان. دلێ وی بڤان دیمەنێن جوان گەلەک خۆش بوو، پشتی گەهیشتینە وێدەرێ دناڤ ئاڤێدا هۆگری یاری دکرن، ئەلند نیاسی و بوونە هەڤالێن ئێک و دانوستاندن کرن.

هۆگر: ئەلند لە کوێ هاتووی؟

ئەلند: ئەز ژ دهۆکێ هاتیمە.

هۆگر: دەچیتە قوتابخانە؟

ئەلند: بەلێ و ئەز گەلەکێ زیرەک و چەلەنگم.

هۆگر: سالێ داهاتوو دێمە شاری دهۆک و بە کرمانجی دێ ئاخڤم.

ئەلند: بەلێ ئەم یەک میللەتین.

پاشان خودا حافیزی ل ئێکو دوو کر. هەر یەک چوو دەڤـ خێزانا خۆ.

ئەلندی گوتە بابێ خۆ: بۆچی هەتا نهۆ مە ئێک زمانێ خواندن و نڤیسینێ نینە؟

باب: ئەلند ما تە ئەو داروبار نەدیتن هەمی ییێن ڕەش بووی، خەملا چیایان گوهارتبوو؟ ئەو دوژمنێ میللەتێ کورد سۆتاندبوون و وان نەدهێلا ئەم ببینە یەک، لێ کورد یەکن و نابنە دوو.

ئەلند: سۆزبیت بابە گیان سالا داهاتی ب کرمانجییا ژێری باخڤم.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| هاڤینگە | : | هاوینەهەوار |
| برێڤە | : | لە ڕێگادا |
| بەرێ خۆدا | : | تەماشای کرد |
| گر | : | گرت |
| نهال | : | گەلی |
| پشتی | : | دوای |
| بڤان | : | بەمانە |
| وێرێ | : | ئەوێ |
| چەلەنگ | : | چالاک |
| نهۆ | : | ئێستا |
| گوهارتبوو | : | گۆڕیبوو |
| خەمل | : | جوانی |
| لێ | : | بەلاّم |
| باخڤم | : | قسەبکەم، بدوێم |
| ڤانە | : | ئەمانە |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. هۆگر و خێزانا خۆ کیڤە چوو بوون؟

٢. هۆگری دپەنجەرا ئوتومبێلێ ڕا چ دیت؟

٣. هۆگری کی ناسی؟

٤. ئەلند ل چ باژێڕ هات بوو؟

٥. ئەلندی چ سۆزدا؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. هۆگری ............... دکرن.

٢. هۆگر و ............... بوونە هەڤالێن ئێک.

٣. باب: ما تە ئەو ............... هەمی پێ ڕەش بوون.

٤. ئەلند گەلەکی ...............

## چالاکی (١)

١. ناڤێن سێ هاڤینگەهێن کوردستانی بنڤیسە.

ئـ. ............... ب. ............... پ. ...............

٢. هەر هاڤینگەهەک ژ ئەوێن تە نڤێسین دکەڤنە کیژ پارێزگەهێ؟

٣. بۆچی دبێژنێ هاڤینگەهـ؟

ئەگەر پێویست بوو: مامۆستا یارمەتی قوتابییان بدەت.

## چالاکی (٢)

هەر قوتابییەک باسی سەیران بکات، کە لە ڕۆژی نەورۆز لەگەڵ خێزانەکەی کردوویەتی.

## چالاکی (٣)

هاڤین + گە ←——— هاڤینگە

تۆش ئەم وشانە وەکو سەرەوە لێبکە:

دەرمان + گە ←———

جێ + گە ←———

دەر + گە ←———

خوێندن + گە ←———

پەیمان + گە ←———

کار + گە ←———

# كۆتر و مێروولە



جارێکیان کۆترێک بۆ ئاو خواردنەوە لەسەر کەناری ڕووبارێک ڕاوەستابوو، چاوی بەمێروولەیەک دەکەوێت، کەوتۆتە ناو ڕووبارەکەوە، خەریکە بخنکێت. کۆترەکە دڵی بە مێروولە هەژارەکە سووتا و چیلکە دارێکی بۆ هاوێشت، تا خۆی پێوە بگرێتەوە، مێروولەکە سواری چیلکەدارەکە بوو، لە خنکان ڕزگاریبوو. زۆر سوپاسی کۆترەکەی کرد.
پاش ماوەیەکی کەم، کۆترەکە بۆ سەردارێکی نزیک ڕووبارەکە هەڵفڕی، ڕاوکەرێک چاوی پێکەوت و ویستی ڕاوی بکات.



مێرووله‌كه‌ دیتی ڕاوكه‌ره‌كه‌ ده‌یه‌وێت كۆتره‌كه‌ ڕاوبكات، له‌ دڵی خۆیدا گوتی: ئه‌و كۆتره‌ منی له‌ خنكاندن ڕزگاركرد، پێویسته‌ منیش ئه‌و رزگار بكه‌م. پاشان مێرووله‌كه‌ خێرا خۆی گه‌یانده‌ ڕاوكه‌ره‌كه‌ و توند لاقی گه‌ست، ڕاوكه‌ره‌كه‌ ئاوڕیدایه‌وه‌ و ئاگای له‌ كۆتر نه‌ما.

له‌و كاته‌دا كۆتره‌كه‌ هه‌ڵفڕی و له‌ پاداشتی ئه‌و چاكه‌یه‌، كه‌ له‌گه‌ڵ مێرووله‌كه‌دا كردبووی، له‌ مردن ڕزگاربوو.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| کەنار | : | ڕۆخ، قەراخ |
| باشی | : | چاکی |
| لەو کاتە | : | لەو دەمە |
| چیلکە | : | دارێکی باریک |
| خێرا | : | بەلەز، بە پەلە |
| گەست | : | گازی لێگرت |
| هاوێشتی | : | فڕێیدا |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. کۆترەکە لە ڕوبارەکە چی دیت؟

کۆترەکە لە ڕوبارەکە ................ دیت خەریک بوو بخنکێت.

٢. کۆترەکە چی بۆ مێرووڵەکە کرد؟

کۆترەکە ................ دارێکی بۆ مێرووڵەکە هاوێشت بۆ ئەوەی پێیدا هەڵبگەڕێت.

٣. مێرووڵەکە چی کرد؟

مێرووڵەکە سواری چیلکەدارەکە بوو لە ................ ڕزگاریبوو.

٤. کێ کۆترەکەی دیت؟

................ کۆترەکەی دیت و ویستی ڕاوی بکات.

٥. مێرووولەکە لە دڵی خۆیدا چی گوت؟

گوتی: پێویستە من هەوڵبدەم بۆ ................ ئەو کۆترەی کە منی لە خنکاندن ڕزگارکرد.

## ڕاهێنان (٢)

بۆ وانەی داهاتوو هەر خوێندکارێک خۆی ئامادەبکات بەسەرهاتێکی خۆشمان لەناو پۆل بۆ بگێڕێتەوە.

## ڕاهێنان (٣)

ئەم وشانە بنووسەوە:

ئـ- تەڕ و وشک

ب- دار و بەرد

پ- ڕەش و سپی

ت- گژ و گیا

# چالاکی

تۆ چاکە بکە و بیدە بە ئاوا

با کەس نەزانێ لای خوا نووسراوە.

دووجار ئەم دێرە هۆنراوەیە بەخەتێکی جوان بنووسەوە.



# کوردستان



ئەم کوردستانە جوانە
خـوێن و دڵ و چاومانە
خۆشـم دەوێ پڕبەدڵ
ئـەیپارێزم وەکو گوڵ
سەربازی گەل و خاکم
ڕۆڵەی چوست و چالاکم
کـوردسـتان دەپـارێزم
بە هەموو توانا و هێزم
سنگم دەکەم بە قەڵغان
بۆ بـەرگـری نیـشتمان.

( محەمەد پاکژ )

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
| --- | --- |
| سەرباز | پێشمەرگە |
| ڕۆڵە | کوڕ |
| توانا | شیان |
| قەڵغان | سپەر |
| نیشتمان | وڵات |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. وڵاتی کوردان ناوی چییە؟

٢. ئاڵای کوردستان چەند ڕەنگە؟

## چالاکی

* ناوی پێنج شار لە کوردستان بڵێ؟

* مامۆستا نەخشەی کوردستان پیشانی قوتابییان بدات.

* مامۆستا ئاڵای کوردستان بە ڕەنگەوە پیشانی قوتابییان بدات.

* چوار قوتابی لای تەختە ڕەشە ڕابوەستن ،

یەکێکیان بڵێت: من (مەهاباد)م

ئەوەی دییان بڵێت: من (دیاربەکر)م

ئەوەی دی من (کەرکوک)م

چوارەم بڵێت: من (قامشلی)م

ئینجا مامۆستا پێیان بڵێت هەریەکە لەم شارانە دەکەوێتە کوێ.

ئینجا هەر چواریان دەستی یەکتر بگرن و بڵێن:

ئاسۆی دەروونم شادە

کوردستانم ئـــــازادە

# زستانی کوردستان



هەموومان دەزانین کە ساڵ بریتییە لە چوار وەرز:

بەهار، هاوین، پایز، زستان.

بەهار سەری ساڵە و سەرەتای ژیانەوەی دار و درەخت و گژوگیایە. پاش بەهار هاوین دێت و هەوا گەرم دەبێت و میوە پێدەگات و دەغڵودان دەدروێتەوە. ئینجا پایز دێت و لە پایزدا بەرهەمی ساڵ کۆ دەکرێتەوە و ئازووخەی زستان ڕێکدەخرێت. لە دوای هەموویان زستان دێت.

کوردستان، کە زۆربەی خاکەکەی شاخاوی و کوێستانە، لە زستان هەوای سارد دەبێت و بەفر و بارانی لێدەبارێت، شاخەکانی بەرگێکی سپی بێگەرد دەپۆشن و خەڵکی بۆ خۆ پاراستن لە سەرما جل و بەرگی گەرم لەبەر دەکەن و کاتێک لە ماڵ چوونە دەرەوە، خۆیان باش دەپێچنەوە.

سەرەڕای ئەوەی زستان سارد و سەرمایە و بەفر ڕێگای سەیران و چوونە دەرەوە دەگرێت، زۆر شتی خۆشی تێدایە.

دوای بەفربارین، شێرە بەفرینە دروستدەکەین و لەگەڵ هاوڕێکانمان شەڕە تۆپەڵ دەکەین. شەوان لە ماڵەوە دادەنیشین، دوای نووسینەوەی وانەکانمان لەناو نوێنی گەرمدا دەنووین و خۆمان بۆ کار و خوێندنی سبەینێ ئامادە دەکەین.



## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| بریتییە | : | پێکدێت |
| زۆربەی | : | زۆرینە ، بەهراپتر |
| خاک | : | زەوی |
| شاخ | : | چیا ، کێو ، کەژ |
| ئامادە دەکەین: | | خۆبەرهەڤ دکەین |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١. ساڵ لە چەند وەرز پێکدێت؟

٢. وەرزی بەهار چۆن دەبێت؟

٣. هەوای کوردستان لە زستان چۆنە؟

٤. لە زستان بۆچی ڕێگای سەیران دەگیرێت؟

٥. شێرە بەفرینە چییە؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم ڕستانەی خوارەوە بەڕاستی و بەهێڵێک بەیەکتر بگەیەنە:

| | |
|---|---|
| ساڵ بریتییە لە | دروست دەکەین |
| لە پاییزدا بەرهەمی ساڵ | چوار وەرز |
| شێرە بەفرینە لە زستان | کۆ دەکرێتەوە |

## چالاکی

ئەم وشانەی خوارەوە بخوێنەوە:

شاخ و داخ

بەرد و هەرد

شوان و گاوان

چاو و برۆ

مێوژ و گوێز

شێر و پڵنگ

تیر و کەوان

# شێوازی ئاخاوتن



باوکێک ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد ، دەیگوت:

ڕۆڵەی خۆم ئەگەر لە کۆڕێک دانیشتیت کەم بڵێ و زۆر ببیستە، ئەگەر ویستت قسە بکەیت، قسە بە کەس مەبڕە، چاوەڕوانی ئەوەبە تا نۆرەی تۆ دێت و خەڵکەکە هەموو گوێت لێدەگرن.

جا کە قسەت کرد، درێژەی پێ مەدە، چونکە ئەوەی زۆر بڵێت، هەڵەش زۆر دەکات، با قسەکانیش ڕوون و ڕەوان بن، ڕاوێژت خۆش و گفتت شیرین بێت، بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵکەکە ڕابکێشیت و کاریان لێبکەیت.

ڕۆڵەی خۆم ئەگەر یەکێک قسەی بۆ کردیت، چاک گوێی لێبگرە، بە شتی دیکە خۆت خەریک مەکە، چونکە چاک گوێ لێگرتن بەڵگەی پەروەردەی باش و ڕەوشتی پێگەیشتووە.

# واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| ببیستە | : | گوێی لێبگرە، گوهێ خۆبدێ |
| ڕاوێژ | : | شێوەی قسەکردن |
| گفت | : | وتە، ئاخافتن |
| شێواز | : | ڕێوشوێن |

## ڕاهێنان (١)

نیشانەی (✓) لەبەر دەم ڕستەی تەواو دابنێ:

١. ئەگەر یەکێک قسەی بۆ کردیت:

(    ) پەڕتوکێک بخوێنەوە.

(    ) ڕووی تێبکە و گوێی بدەیە.

(    ) لەگەڵ هاوڕێیەکەتدا ئاخاوتن بکە.

(    ) قسەی پێ ببڕە.

٢. ئەگەر قسەت بۆ یەکێک کرد:

(    ) زۆر بڵێ.

(    ) دەنگت بەرز کەوە.

(    ) بە دەنگێکی لەسەرخۆ و ڕەوان قسەبکە.

(    ) قسەی ئاڵۆزی بۆ بکە.

## ڕاهێنان(٢)

ئەم وتووێژە تەواوبکە و لەگەڵ هاوڕێیەکەت (بە دوو قۆڵی گفتوگۆ بکە) بە مەرجێک شێوازی ئاخاوتن پەیڕە و بکەن:

ئازاد : ڕۆژ باش.
سەربەست: .........

—— : بۆ کوێ دەچیت؟
—— : .........

—— : لە قوتابخانە چی فێر دەبیت؟
——: ..........

—— : قوتابخانەی خۆت خۆشدەوێت؟
——: ..........

—— : بۆچی قوتابخانەی خۆت خۆشدەوێت؟
—— : .........

## چالاکی

بەجوانی ئەم پەندە دووجار لە تێنووسەکەت بنووسە.

**قسە هەزارە و دووانی بەکارە.**

# شێر و مشک



ڕۆژێک لە ڕۆژان شێرێک گەڕایەوە لانەکەی خۆی، دیتی مشکێکی بچووک دەسوڕێتەوە، بۆ ئەوەی شتێک بدۆزێتەوە بیخوات.

مشکە بچکۆڵەکە، کە چاوی بەشێرەکە کەوت، لەترسان لەرزی لێهات، وایزانی شێرەکە دەیخوات.

بەڵام شێرەکە ئازاری نەداو گوتی:

مەترسە نات خۆم.

مشکەکە زۆر سوپاسی لێبووردن و دڵ نەرمی شێرەکەی کرد و لانەکەی جێهێشت.

پاش چەند ڕۆژێک مشکەکە دیتی وا شێرەکە کەوتۆتە ناو تۆڕی نێچیروانێک.

چووە لای شێرەکە و پێیگوت:

گەورەم ڕێم بدەن، تا ڕایەلی تۆڕەکە بقرتێنم ڕزگارتان بکەم.

شێرەکە گوتی:

پێویستم بەهاوکاری تۆ نییە بەهێزی خۆم دەپیسێنم.

مشکەکە لە لایەکەوە وەستاو دیتی شێرەکە هەوڵ دەدات بۆ ئەوەی خۆی لە تۆڕەکە ڕزگار بکات.

پاش هەوڵێکی زۆر شێرەکە نەیتوانی خۆی ڕزگار بکات.

مشکەکە دیسان چووە پێشی و گوتی:

ئەگەر هێز و توانای خۆت بە کەڵکت نەهات، باشی و دڵنەرمیت بە هاوارتەوە دێت.

ئینجا ئەوجا دەستیکرد بە قرتاندنی تۆڕەکە تا چەند ڕایەڵێکی قرتاند.

شێرەکە ڕزگاری بوو و زۆر سوپاسی مشکەکەی کرد، کە پاداشتی چاکەکەی دایەوە و گوتی:

ڕاستە ژیری بەگەورەیی و بچووکی نییە، پاداشتی چاکەش هەر چاکەیە.

# واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| گەورەیی | : | مەزناهی |
| هاوکاریی | : | یارمەتی، ئالیکاری |
| لانە | : | بێشە |
| بقرتێنم | : | بکرتێنم، بپچڕێنم |
| نێچیروانێک | : | ڕاوچییەک |

## ڕاهێنان ( ١ )

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. شێرەکە لە لانەکەیدا چی دی؟

شێرەکە لە لانەکەی خۆیدا ................ بچووکی دی.

٢. مشکەکە بۆچی دەگەڕا؟

مشکەکە دەگەڕا، بۆ ئەوەی ................ بدۆزێتەوە بیخوات.

٣. مشکەکە لەبەرچی دەلەرزی؟

مشکەکە لە ................ دەلەرزی.

٤. مشکەکە چی بە دڵدا هات؟

مشکەکە ئەوەی بە دڵدا هات، کە شێرەکە ................

٥. شێرەکە دەیتوانی خۆی لە تۆڕەکە ڕزگار بکات؟

نەخێر .............. توانای نەبوو خۆی لە .............. ڕزگار بکات.

٦. مشکەکە بۆ ڕزگارکردنی شێرەکە چی کرد؟

مشکەکە دەستیکرد بە ................ تۆڕەکە.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم ڕستانە بخوێنەوە:

١.وای زانی دەیخوات.

٢.وای زانی براکەیەتی.

٣.وای زانی نەهاتووە.

٤.وای زانی جەژنە.

٥.وای زانی چاکە.

٦.وای زانی باوکیەتی.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم پەندە جوان لە تێنووسەکەت بنووسەوە:

﴿ ژیری بە گەورەیی و بچووکی نییە ﴾

# پەشیمانی



ڕۆژێک مێروولەیەک لەناو شارەکەی خۆی هەر لە خۆڕاو بەبێ هیچ هۆیەک توڕەبوو و لە شارەکە چووە دەرەوە.

گوتی: من دەمەوێ بە تەنیا بژیم، چووە ماڵ و شوێنێکی بۆ خۆی دروستکرد. ئینجا بەدوای خواردندا گەڕا و چەند دەنکە گەنمێکی پەیدا کردو بردییە ناو ماڵەکەی خۆی. دوای ماوەیەک دەنکە گەنمەکان شینبوون و دەرگای ماڵەکەی لێگیرا و دەستی بە هاوار هاوارکرد. کەسوکارەکەی بە هاوارییەوە چوون و ڕزگاریان کرد و پێیان گوت:

تۆ بۆچی ئەوەندە کەللە ڕەقی و زوو توڕە دەبیت؟ ئەی نازانی دەنکە گەنم یان هەر تۆیەکی دی نابێت بە ساغی لەناو ماڵدا هەڵبگیرێت بەڵکو دەبێت یەکسەر بکرێت بە دوو پارچەوە چونکە بە ساغی شیندەبێتەوە، دەبێت بزانی کەس بەتەنیا ناتوانێت بژیت و توڕە بوونیش ڕەوشتێکی باش نییە، هەموو کەسێکیش لەناو کەسوکاری خۆیدا بە نرخە.
مێرووله تووڕەکە دەستی بە گریان کرد و گوتی:
زۆر پەشیمانم لەم کارەی کە کردم، بەڵام ئەم جیابوونەوەم وای لێکردم کە تا ژیانم ماوە نیشتمانی خۆم و شاری خۆم و کەسوکاری خۆم خۆشبوێت و جێیان نەهێڵم و توڕەنەبم.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| شار | : | باژێر |
| لە خۆڕا | : | ژخۆڕا |
| شینبوو | : | ڕوا |
| بە دوای | : | بدووڤ |
| دەنک | : | دندک |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. زیانەکانی توڕەبوون چین؟

٢. کاتێ مێروولەکە دەرگای لێگیرا کێ بەهانایەوە چوو؟

٣. ئایا مرۆڤ دەتوانێت بە تەنیا بژیت؟

## چالاکی (١)

مامۆستا باسی پێکەوە ژیانی مرۆڤ بۆ قوتابییان بکات، کە کەس ناتوانێت تەنیا بژیت و هەموو کەسێك پێویستی بەکەسانی دی دەبێت. دەتوانێت پەیوەندی نێوان مامۆستا و قوتابییەکانی وەک نموونە بۆ ئەو پێکەوە ژیانە باس بکات.

## چالاکی (٢)

ئەم بۆشاییانە بە وشەکانی ناو لاکێشەکە پڕ بکەوە:

............. مێروولە یە.

............. ئەستێرەن بە ئاسمانەوە.

............. منداڵن لەناو باخەکە.

............. باڵندەیە دەفڕێت.

| ئەوانە، ئەمە، ئەمانە، ئەو |
|---|

## چالاكی (٣)

ئـ - منداڵ ب - ئەم منداڵە پ - ئەم منداڵانە

قوتابی ژیر: تۆش ئەم وشانە وەکو ئەوەی سەرەوە لێبکە:

| ئـ - | ب - | پ - |
|---|---|---|
| پیاو | | |
| کۆتر | | |
| گوڵ | | |
| مێش | | |
| هەنگ | | |
| مریشک | | |

## چالاكی (٤)

### توڕەبوون چرای بیرکردنەوە دەکوژێنێتەوە
### هەموو توڕەبوونێک پەشیمانی لە دوایە

بە جوانی ئەم دوو دێڕەی لای سەرەوە لە تێنووسەکەت بنووسەوە، پاشان بۆمان باس بکە.

# ژینـــــــــــی لادێ



ژینی لادێ سەیرانــە
گەرچی تۆزێک گرانە

ڕۆژی نەورۆز سەری ساڵ
دەکەونە ئیش کوڕ و کاڵ

یا جووت یا جۆگە هێنان
بۆ ئاو داشتن دەغـڵ و دان

یــا دار بــڕیـــنی شاخە
یا خۆ پەرژیـنی بـــاخە

یا تووتنە یـــا درەو

ناوەستن بە ڕۆژو شەو

یـــا گـێرە یـا شەن کردن

هەڵمەت بۆ فــەرمان بردن

فــەرقی نییــە نێر و مێ

هەرچی دانیشتووە لە دێ

گشت خەریکی فەرمانن

بـــۆ دەســهێنانی نـــانن

تا تەواو دەبێت هاوین

تێدەکۆشن زۆر بەتــین

(قانیع)

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| لادێ | : | گوند ، دێ |
| ئاوداشتن | : | ئاودێری |
| درەو | : | درویّنە ، دەغڵ دروونەوە |
| شەن کردن | : | هەلاڤیتن، دان بەبا |
| تێدەکۆشن | : | خەبات دەکەن، هەوڵدەدەن |
| فەرمان | : | کارکردن، شۆل |

## راهێنان (١)

هۆنراوەکە بخوێنەوە و وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. چەند ئیش و کارێکی لادێ بژمێرە؟

٢. لادێییەکان بەچییەوە خەریکن؟

## راهێنان (٢)

ساڵ لە چوار وەرز پێکهاتووە، کە یەک بەدوای یەکدا دێن، ڕیزیان بکە؟

١. زستان

٢. هاوین

٣. بەهار

٤. پایز

## راهێنان (٣)

نیشانەی ( ✓ ) بەسەر ئەو وشەیەدا بهێنە کە ڕاستە:

ئێمە لە (لادێ، شار) دەژین.

ڕۆژی نەورۆز (سەری، کۆتایی) ساڵە.

جووتیار (گێرە، دوورمان) دەکات.

# دراوسێی باش

ماڵی سیروان و ماڵی پەری دراوسێ بوون، باوکی هەردووکیان لێک توورە ببوون و لەسەر منداڵەکانیان قسەیان لەگەڵ یەکتر نەدەکرد.

ڕۆژێك دایکی پەری نەخۆشکەوت و پێویستی بە نەشتەرگەری دەکرد. پزیشکەکەی داوای قاپێک خوێنی بۆ کرد. باوکی پەری ئەوەندەی گەڕا خوێنی دەست نەکەوت و خوێنی خۆشی لە جۆری ئەو نەبوو.



باوکی سیروان که زانی، به پەلە گەیشتە نەخۆشخانە و خوێنی خۆی پشکنی، دیتی لە جۆری خوێنی دایکی پەرییە. بە پزیشکەکەی گوت: من خوێنی پێدەبەخشم.
باوکی پەری سوپاسی کرد و پێی گوت: لێم ببوورە، نەم دەزانی ئەوەندە بە کەڵکی دراوسێکەت دێیت.
پەریش سوپاسی سیروانی کرد و پێی گوت: نابێت چیدیکە لێک تووڕە ببین.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
| --- | --- | --- |
| دراوسێ | : | هاوسێ |
| نەخۆشکەوت | : | نەساخبوو |
| پێویست | : | پێدەڤی |
| بە پەلە | : | بلەز، زوو |
| پێدەبەخشم | : | دەی دەمێ |
| چیدیکە | : | چیتر |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. بۆچی باوکی سیروان و باوکی پەری قسەیان لەگەڵ یەک نەدەکرد؟

٢. بۆچی باوکی پەری خوێنی نەدا بە دایکی پەری؟

٣. ئایا دەبێت دراوسێ قسە لەگەڵ یەکدی نەکەن؟

٤. کێ بە هانای دایکی پەری چوو و خوێنی پێ بەخشی؟

٥. پەری چی بە سیروان گوت؟

## چالاکی (١)

پێویستە مامۆستا مافی دراوسێ بۆ قوتابییان ڕوونبکاتەوە و داوایان لێبکات هەر قوتابییەک باسی مافێک لە و مافانە بکات.

## چالاکی (٢)

مامۆستا دەتوانێت لەم بۆنانەدا پرسیار لە قوتابییان بکات کە دەبێت بەرامبەر دراوسێکانمان چۆن بین؟ ئینجا مامۆستا زیاتر بۆ قوتابییان ڕوون بکاتەوە، بۆنەکانی وەک: جەژن، بووک گواستنەوە، پرسە، نەخۆشکەوتن... هتد.

# بولبولێکی داماو



ڕۆژێکیان سۆلاڤ و سۆلین لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە سەر لە باخچەی گشتی بدەن، پاش ئەوەی گەیشتنە باخچەکە و بەناویا دەسووڕانەوە، چاوییان بە بولبولێکی زامدار کەوت، کە زۆر داماو بوو. سۆلاڤ و سۆلین هەڵیانگرت و بردیانە ماڵەوە.

لە ماڵەوە زامەکەیان تیمارکرد و دان و ئاویان بۆ دانا و بە دەور و پشتیا دەهاتن، پاشی چەند ڕۆژێک بولبولەکە وردە وردە بەرەو چاکبوونەوە دەچوو پاشان خستیانە ناو قەفەزێکی ڕەنگینەوە و ڕۆژانە سەردانیان دەکرد و تەماشایان دەکرد زۆر کز و داماوە و لە جاران خراپترە، بۆیە سۆلاڤ بە سۆلینی گوت:

ئەم بولبولە خوازیاری سەربەستی و ئازادییە، بۆیە سۆلین دەرگای قەفەزەکەی کردەوە و بولبولەکە لە شەقەی باڵی دا و بەرەو خۆری ئازادی باڵی گرت و بەرزبۆوە.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| داماو | : | دامای، غەمگین |
| هاوڕێ | : | هەڤاڵ، برادەر |
| ئازادی | : | سەربەستی |
| لق | : | لک، چل |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. سۆلاڤ و سۆلین بڕیاریاندا بۆ کوێ بچن؟

٢. بولبولێکی چۆنیان دیت؟

٣. بولبولەکەیان بۆ کوێ برد؟

٤. سۆلاڤ چی بە سۆلین گوت ؟

٥. **بولبولەکە** بۆ کوێ فڕی؟

٦. بۆچی کە سۆلین بولبولەکەی بەردا دەستی بە خوێندن کرد؟

## چالاکی (١)

ناوی هەندێك گیانداری سوودبەخش و زیانبەخش بنووسە.

| سوودبەخش | زیانبەخش |
|---|---|
| ١. | ١. |
| ٢. | ٢. |
| ٣. | ٣. |
| ٤. | ٤. |

# چالاكی (٢)

پێویستە مامۆستا بۆ خوێندكارانی ڕوونبكاتەوە كە سەربەستی نەک هەر بۆ مرۆڤ، بەڵكو بۆ هەموو گیاندارێک پێویستە. دەتوانێت پرسیاریان لێبكات ئەگەر دایک و باباتان نەهێڵن حەفتەیەک لە ژوورێكی ماڵەوە بێنە دەرەوە هەست بەچی دەكەن؟



# مین



ئای کە مین ڕەزا قورسە     زۆر بەسام و بە ترسە
ڕقی لە من و لە تۆیە     دوژمنی هەموو مرۆیە
بۆ ئێمە وەک تەڵەیە     دەسکاریکەی هەڵەیە
بە هەڤاڵانت بێژە     هەر شوێنێ کە مین ڕێژە
با نەچن بۆ ئەو جێیە     کە مینی بەدخوی لێیە
نەک بتەقێ و بتکوژێ     خوێنی پاکت بڕێژێ
هەزار نەفرەتی لێبێ     جا لەهەر شوێن و جێبێ

(محمد دارياس)

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| بەسام | تۆقێنەر |
| ڕق | کینە |
| مرۆ | مرۆڤ . ئینسان |
| تەڵە | داو . بۆسە |
| ببێژە | پێیان بڵێ |
| بەدخو | بەدڕەوشت . خراپەکار |
| نەفرەت | لەعنەت |

---

محمد دارياس:

لە ساڵی ١٩٥٢ لەشاری کۆیە هاتۆتە دنیاوە تا ئێستا چەندین نامیلکەی بەچاپ گەیاندووە .
بەرهەمەکانی بەزمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی بڵاودەکاتەوە، ئێستا مامۆستایە لە شاری کۆیە .

## ڕاهێنان

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕبکەوە:

١ - ڕقی لە ............... و لە .............. .
٢ - بۆ ئێمە وەک............ .
٣ - دوژمنی هەموو ............ .
٤ - با نەچن بۆ ئەو ............ .

## چالاکی

١- مین چییە؟
٢- بۆچی ڕقت لە مینە؟

# میرێکی ناودار



بنەماڵەی بەدرخانییەکان میللەتپەروەر و ڕۆشنبیر و نیشتمانپەروەر بوون، میری زاناو دانا و میرخاسیان لێ هەڵکەوتووە، یەک لەو میرانە جەلادەت بەدرخان بوو، کە لە ساڵی (١٨٩٣)ی زایینی لە شاری ئەستەنبۆل هاتۆتە دونیاوە.

جەلادەت بەدرخان هەمیشە دڵسۆزی پرسی ڕەوای میللەتەکەی بووە، بەشداری لە شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و ئاگریداغدا کردووە. میرێکی ڕۆشنبیر بووە، گۆڤاری ( هاوار )ی لە شام دەرکردووە، بۆ یەکەم جار پیتی لاتینی بۆ نووسینی کوردی داناوە. لەتەمەنی پەنجاو هەشت ساڵیدا لە ساڵی (١٩٥١)ی زایینی لەنەخۆشخانەی فەڕەنسی لە شام کۆچی دوایی کردووە.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| بنەماڵە | : | ماڵبات |
| نیشتمانپەروەر | : | وڵاتپارێز |
| مێرخاس | : | دلێر |
| پرس | : | دۆز، کێشە |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. میر جەلادەت بەدرخان کێ بوو؟

٢. کەی لەدایکبووە و کەی کۆچی دوایی کردووە؟

٣. بەشداری لە کام شۆڕشدا کردووە؟

٤. بۆ زمانی کوردی چی کردووە؟

٥. کێ بۆ یەکەمین جار پیتی لاتینی بۆ نووسینی کوردی داناوە؟

# چالاکی (١)

مامۆستا، ڕۆڵی میر جەلادەت بەدرخان لە بواری ڕۆشنبیری بۆ قوتابییان ڕووندەکاتەوە، دەرهێنانی گۆڤاری ( هاوار ) بە نموونە باس دەکات، هەروەها دانانی پیتی لاتینی بۆ نووسینی کوردی.

## چالاكی (٢)

ناو + دار = ناودار

تۆش ئەمانەی خوارەوە وەكو سەرەوە لێبكە:

دڵ + دار =

دین + دار =

پایە + دار =

گوهـ + دار =

خێزان + دار =

بەهرە + دار =

ناز + دار =

برین + دار =

# هەرەوەز



کوڕێ بوو ناوی دارا بوو
وریا و زیرەک و دانابوو
هەرچی کەوتە بەر چاوانی
دەچووە بنج و بناوانی
ڕۆژێ ئەوە دیقەتی کرد
تەنیا مێروولەیەکی ورد
لە دەنکە گەنمێ ئالاوە
زۆر بەدەستییەوە داماوە
چەندی ئەکرد بۆی نەدەبرا
هێز و قووەتی لێبڕا
ئەمجا ماندوو بوو لێیدا ڕۆی
هی تری هێنا لەگەڵ خۆی
چوونە سەری و کاتێ زانی
گەنمیان برد بە ئاسانی
دارا لەمە عیبرەتی گرت
پەندێکی باشی لێوەرگرت
وتی هەر کارێ گرانە
بە هەرەوەزی ئاسانە

(بێکەس)

# واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
| --- | --- | --- |
| دیقەتی کرد | : | لێیورد بووەوە |
| دەچووە بنج و بناوانی | : | لێیدەکۆڵیەوە |
| بۆی نەدەبرا | : | نەیدەتوانی بیبات |
| هەرەوەز | : | هاریکاری، زبارە |
| عیبرەتی گرت | : | پەندی لێ وەرگرت، تێگەیشت |

# دەستپاکی



ڕۆژێک لە ڕۆژان، کرێکارێکی هەژار دیواری ماڵی پیاوێکی دەوڵەمەندی دەڕووخاند، لەکاتی ئیشکردندا تووره‌گەیەکی پڕ لە زێڕی دۆزییەوە و هەڵیگرتەوە، تا خاوەن ماڵەکە هاتەوە، دایەوە دەستی و گوتی:

(( گەورەم ئەم تورەگەیەم لە کاتی ئیشکردندا دیتەوە )).

پیاوەکە زۆر دڵی پێ خۆشبوو، پێی گوت:

(( لەمێژە ئەم زێڕانەم لەژێر ئەم دیوارەدا شاردبۆوە و جێگەکەم نەدەدیتەوە، گەلێک بە دوایدا گەڕام، بەڵام نەم دۆزییەوە، نیشانەی ڕاستی ئاخافتنەکەشم ئەوەیە کە دوو سەد لیرەی زێڕی تێدایە )).

ئینجا له‌ كرێكاره‌كه‌ی داواكرد، كه‌ زێڕی ناو توره‌گه‌كه‌ بژمێرێت، كه‌ ژماردی دیتی دووسه‌د زێڕه‌.
به‌ دڵخۆشی دایه‌وه‌ ده‌ست خاوه‌ن ماڵه‌كه‌، ده‌وڵه‌مه‌نده‌كه‌ش له‌به‌ر ڕاستگۆیی و ده‌ستپاكی بیست لیره‌ی زێڕی دا به‌ كرێكاره‌كه‌.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| نیشانە | : | بەڵگە |
| داوای کرد | : | خواست |
| دەڕووخاند | : | هەرفاند ، ڕماند |
| دیتەوە | : | دۆزییەوە |
| زێڕ | : | ئاڵتون |

## ڕاهێنانی (١)

ئەم وشانە بخەرە ڕستەی تەواوەوە:

( دایک، شێر، منداڵ، کۆتر، کەو )

## ڕاهێنان (٢)

وەڵامی ئەم پرسیارانە تەواوبکە:

١. کرێکارەکە چی دەکرد؟

کرێکارەکە لەماڵی پیاوێکی دەوڵەمەند ................

٢. کرێکارەکە چی دیتەوە؟

................یەکی دیتەوە گەلێک ................ تێدابوو.

٣. کرێکارەکە چی بە خاوەن ماڵەکە گوت؟

کرێکارەکە بە خاوەن ماڵەکەی گوت: ((گەورەم ئەو ............ لەکاتی ئیشکردندا دۆزییەوە )).

٤. خاوەن ماڵەکە داوای چی لە کرێکارەکە کرد؟

خاوەن ماڵەکە داوای لە کرێکارەکە کرد کە زێڕەکانی ناو کیسەکە ...............

٥. بۆچی خاوەن ماڵەکە بیست لیرەی زێڕی دا بە کرێکارەکە؟

خاوەن ماڵەکە لەبەر ڕاستگۆیی و ............ بیست لیرەی زێڕی دا بەکرێکارەکە.

٦. ئەگەر تۆ هەر شتێکت دۆزییەوە، چی لێدەکەیت؟

# کولێرە



دایکی بارام و زارا هەشت نۆ کولێرەی لە تەنـدوور دەرهێنـا و لـەژێر قولێنەی سەر کەندووی ئاردەکەدا شاردییەوە، زارا و بارام، ئەملا گـەڕان کولێرە نەبوو، ئەولا گەڕان کولێرە نەبوو.

زارا دەستی دایکی گرت و گوتی:

- دایە گیان تو سەری خالم سەرو کولێرەمان پێبدە.

دایکیان گوتی:

- با باوکتان لە ئاش بێتەوە.

بارام دەستی بە نووزە نووز کرد و گوتی:

- دایەگیان زۆرم برسییە. هیچ نەبێت لە تێ کولێرەمان پێبدە.

دایکی گوتی:

کوڕم هەکا باوکتان گەڕایەوە، ئەو کاتە هەموو پێکەوە دادەنیشین و هەر کەسە کولێرەی خۆی دەخوات، بەڵام ئێستا نە باوکتان لەماڵەو نە کولێرەکانیش دیارن.

بارام گوتی:

باشە ئەوە باوکمان لە ئاشە، ئەی کولێرەکان لەکوێن ؟

دایکی گوتی:

بۆ سەردانی گەنمی کێڵگەکان چوون.

زارا پرسی:

جا کولێرە چی گەنمە؟

دایکی گوتی:

ئەی نازانن کولێرە کیژی خاتوو گەنمە؟

بارام گوتی :

ئەی گەنم کیژی کێیە؟

دایکی گوتی:

گەنم کچی داپیرە زەوی و باپیرە بارانە.

ئەمان لەم قسانە بوون، باوکیان لە ئاش گەڕایەوە و هەشت نۆ کـولێرەی زەردی جوانیش سەریان لـەژێر قوڵێنەکـەی سـەر کەنـدووی ئاردەکـەوە دەرهێنا و زارا و بارامیش دایانە قاقای پێکەنین.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| کولێرە | : ئەستورک |
| قوڵێنە | : سەبەتە ، جێنان، تریانە |
| کەندووی ئاردەکە | : کوانوی ئارد |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. دایکی زارا و بارام کولێرەکانی لە کوێ شاردەوە؟

٢. باوکی زارا و بارام لەکوێ بوو؟

٣. کولێرە چی گەنمە؟

٤. زارا و بارام کە باوکیان گەڕایەوە چیان کرد؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم دوو وشانەی خوارەوە چیان کەمە، بۆیان دابنێ و لە پاشاندا بیان خوێنەوە:

نان ................ دۆ

گەنم ................ جۆ

باوک ................ کوڕ

بزن ................ مەڕ

بەفر ................ باران

## چالاکی

ئەم پەندە بە خەتێکی خۆش لە دەفتەرەکەتدا بنووسە.

**(بە هۆی گوڵە گەنمێکەوە سەد گوڵە زیوان ئاو دەخواتەوە)**

# دوو مێشووله



دوو مێشووله سەریان بە یەکدا کردبوو لەگەڵ یەک دەئاخافتن.

مێشوولەی یەکەم: لە کوێوە دێیت؟

مێشوولەی دووەم: لە شارەوە دێم.

مێشوولەی یەکەم: هیچت دەستکەوت؟

مێشوولەی دووەم: ئەدی چۆن؟ خوێنی سێ کەسانم مژی و هەرسێکیانم تووشی نەخۆشیی لەرز و تا کرد.

مێشوولەی یەکەم: هەروەها بە ئاسانی؟

مێشوولەی دووەم: ئەریّ، بە ئاسانی چی؟



لەوانە بوو تووشی هەزار ناخۆشـی ببم. سـەرم بـە ماڵێکـدا کـرد، پەنجەرەکەی تەلبەند کرابوو.

بۆ ماڵێکی دیکە چووم، ئەویش دەرمانیـان پێـوە کردبـوو وەخـت بـوو بێهۆش ببم.

بۆ ماڵێکی دی چووم، لەناو پەردە کوللەدا نووستبوون.

مێشوولەی یەکەم: دوایی؟

مێشوولەی دووەم: دوایی گەڕام... گەڕام تا مـاڵێکی دیکـەم دۆزییـەوە.

تەماشام کرد سێ چوار کەسی تێدا نوستبوون،

نە تەلبەند کرابوو، نە دەرمانی پێوە کرابوو، نە پەردە کوللە.

بێتۆش ناخۆش تیژ و پڕ خوێنەکەیانم مژی.
مێشوولەی یەکەم: نۆشی گیانت بێت، بەڵام نەت بیستووە چی قەوماوە؟
مێشوولەی دووەم: چی بووە ماڵ وێران؟
مێشوولەی یەکەم: دوێنی چوار پێنج کارمەندی تەندروستی بە دەرمـان ورد و درشتیان لەناو بردین، بەڵام باشبوو، من بەرنەکەوتم.
مێشوولەی دووەم: ئەی هاوار هەی! کەواتـە بـەم زووانـە هـەموو بـڵاو دەبینەوە... جا بەبێ خوێن مژین بەچی بژین؟
هەردوو مێشوولە ماوەیەک بێدەنگ بوون پاشان بڕیاریاندا کە زەلکـاوە ژەهراوییەکەیان بەجێ بهێڵن و بۆ زەلکاوێکی دوور بار بکەن...

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| مێشوولە | : پێشکە، پێشی |
| دەئاخافتن | : گفتوگۆیان دەکرد، دپەیڤین |
| باربکەن | : کۆچ بکەن |
| ئاسانی | : ساناهی |
| زەلکاو | : ئاوی بۆگەن |
| درشت | : گەورە |

# ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:

١. دوو مێشوولە سەریان بە یەکدا کردبوو، چییان دەگوت؟

**٢. مێشوولە زیانی چییە بۆ مرۆڤ و کام نەخۆشی تووشی مرۆڤ دەکات؟**

٣. چۆن لە مێشوولە خۆمان بپارێزین؟

٤. دوژمنی مێشوولە چییە؟

٥. پزیشک چۆن خزمەتی وڵاتەکەی دەکات؟

# ڕاهێنان (٢)

ئـ- کرد

ب- کردبوو.

تۆش ئەم وشانەی خوارەوە وەک نموونەی (ب) لێبکە:

گرت

پاراست

برد

نوست

سڕی

# ئەرکیماڵەوە

ئەمانە زیانیان چییە؟

(مێشوولە، زەلکاو، مێش، مشک )

# ئەنجامی لە خۆبایی بوون



لە پشووی وەرزی یەکەم چوومە سەردانی ماڵی باپیرم کە لە گوندێکی خۆش، لە بناری چیای سەفین دەژین، شەوێکیان داپیرە ئەڤ چیرۆکە خۆشەی بۆ گێڕاینەوە.

داپیرە گوتی: ڕۆڵە خۆشەویستەکانم

لە دارستانێک کۆمەڵە درەختێک دەوری دار چنارێکیان گرتبوو، لە زیانی باوبۆران و زریان دەیان پاراست. دار چنار ساڵ لەدوای ساڵ هەڵدەچوو، بڵندتر و بەهێزتر دەبوو تاوای لێ هات بەسەر هەمووان کەوت.

دار چنار لە خۆبایی بوو، فەرمانی دا:
ئەم دار گوێزەی لای ڕاستم ببڕن چونکە پێش هەتاوی لێگرتووم، ڕۆژێکی دی گوتی: ئەڤ دار سێوەی ژێر پێم داپاچن چونکە ڕەگ و ڕیشەی لەهی من ئاڵاوە.

بەم جۆرە بە فەرمانی دارچنار هەموو دارو درەختەکانی دەورووبەری هاتنە بڕین و خۆی بە تەنیا مایەوە.

ڕۆژێک بایەکی توند هەڵیکرد و دارچناری بەملا و بەولادا برد، هەر چەندە ڕەگ و ڕیشەی لە قوڵایی زەوی قایم کردبوو، بەڵام توانای خۆڕاگرتنی نەبوو، لەناکاو قرچەی لێوەهات، پشتی تێکشکاو کەوتە سەر زەوی.



داپیرە گوتی: ڕۆڵەکانم ئەگەر مرۆڤیش لە خۆبایی بوو وەکو ئەو دارچنارەی ناو ئەو دارستانە بە زەویدا دەکەوێت و پشتی دەشکێت.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| پشوو | : | حەسانەوە |
| باوبۆران | : | بای توند و بەهێز کە بارانیشی لەگەڵ بێت |
| هەڵدەچوو | : | بڵند دەبوو |
| لە خۆبایی بوو | : | فیزی لێ پەیدا بوو |
| داپاچن | : | لق و قەدی ببڕن |
| لە ناکاو | : | لەناوەخت، لە پڕ |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. بۆچی کۆمەڵە درەختەکە دەورەی دارچناریان گرتبوو؟

٢. دارچنار فەرمانی چی دا؟

٣. مرۆڤی لە خۆبایی بوو چی بەسەر دێ؟

## چالاکی (١)

خوێندکاری خۆشەویست/ ناوی پێنج داری بەردار و پێنج داری بێ بەر بێژە و پاشان لە تێنووسەکەت ناوەکانیان بنووسە.

## چالاکی (٢)

بەهێز = بەهێزی

قوتابی ئازیز/ تۆش ئەمانەی خوارەوە وەک نموونەی سەرەوە لێ بکە:

بڵند = .................

جوان = .................

کورت = .................

خۆش = .................

زیرەک = .................

مەزن = .................

نەرم = .................

## چالاکی (٣)

ئاگر + دان ⟵ ئاگردان

قوتابی خۆشەویست/ تۆش ئەمانەی خوارەوە وەک نموونـەی سـەرەوە لـێ بکە:

گوڵ + دان ⟵ ..................

شەکر + دان ⟵ ..................

چا + دان ⟵ ..................

خوێ + دان ⟵ ..................

# کوردستانمان شیرینه



کوردستانمان شیرینـــــه
خاکـو ئاوی زێڕینـــــه
شاخ و دۆڵی بەفرینـــە
لەسەر ڕووی ئەم زەمینە
ئاوی گەلێ سازگـــــارە
هەوای خۆش و لەبـــارە
خاوەن گەلێ نـــــاودارە
لەناو جیهاندا دیـــارە
خـــوایە هەر ئاوەدان بـــێ
جێگەی خۆشی و سەیران بێ

( ئیدریس عە بدولا مستەفا )

# پـــەز



لاله شاسوار باخـەوانی چـاکە، حـەز لـە دار و درەخـت دەکـات، لـە باخەکەیدا هەموو جۆرە داری میوەیەک هەیە.

ڕۆژێک دوو مەڕ لە مەڕەکانی کاک ڕۆستەم هاتبوونە نـاو باخەکـەی لاله شاسوار و زیانیان بە باخەکە گەیاندبوو. لاله شاسـوار بەمـە تـوڕە بوو. چوو گازاندەی لە کاک ڕۆستەم کرد و پێی گوت:

- من نازانم ئەم پەزانەی تۆ سوودیان چییە؟ بۆ وازیان لێ ناهێنیت؟ بۆ نایێیت وەکو من ببیت بە باخەوان، هەمیـشە لەنێو گـوڵ و چـیمەن و دارستاندا بژیت و کام میوەی خۆشە بیخۆیت؟

کاک ڕۆستەم وەڵامی دایەوە:
- لالۆ شاسوار! پەزەکانی من ئەگەر سوودیان لە درەختەکانی تۆ زیاتر نەبێت کەمتر نییە!
با پێت بڵێم: مەڕەکەی من دەزێت، بەرخێک یا دووانی دەبێت. شیری هەیە دەیدۆشین. لە شیرەکەی ماست، فرۆ، پەنیر، فەریکەرۆن، شیرێژ، کەشک، گەلێک شتی دی دروستدەکەین. هەموو ساڵێک مەڕەکانم بە جەو دەبڕمەوە و لە خورییەکانیان ئەم شتانە دروستدەکرێت:
جل و بەرگ وەک، فەرەنجی و پەستەک، گۆرەوی، لەپک و پوزەوانە، هەروەها بەرماڵ و جاجم، بەڕە و مافوور، تێڕ و گەلێک پێویستی دیکەی ناو ماڵ.
ئەگەر حەزمان لە گۆشت کرد سەری دەبڕین و جگە لە گۆشت سەرو پێ و سی و جەرگەکەشی دەخۆین، ئینجا پێستەکەی دەکەین بە مەشکە و کوندە و هەمبانە. دەهۆڵ و دەف و قایش و قرۆش زینی ولاغیشی لێدەکرێت.... کەواتە،
پەزەکانی من بێسوود نین و بە کەڵکن.
لالە شاسوار پێکەنی و گوتی: باشە کاک ڕۆستەم ئەوا زانیم.
پەز سوودی زۆرە، بەڵام مەهێڵە بچنە ناو باخەکەی منەوە.
کاک ڕۆستەم لە وەڵامدا گوتی:
وەی بەسەر هەردوو چاوم.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| پەز | : | مەڕ |
| گازاندە | : | گلەیی |
| جەو | : | قەلەغ، مەقەسی مەڕ بڕینەوە. |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١. بۆچی لالە شاسوار تورە بوو؟

٢. لە کۆتایی گفتوگۆ کاک ڕۆستەم بەڵێنی چی بە لالە شاسوار دا؟

٣. پێستی مەڕ و ماڵات بۆچی بەکاردێت؟

## ڕاهێنان (٢)

١. ناوی پێنج بەرهەمی شیری مەڕ بژمێرە.

٢. ناوی پێنج شت بڵێ کە لە خوری دروست دەکرێن.

# پێرست